# | پەیامبەران ..
# وهەڵبژاردەی نەیارانیان ؛

- تیشکێك لەسەر واقیعدا —

-أبو ذر اليمانى
و؛ ئوسامە عبد الله

---

تێڕامانی مرۆڤ لە کتێبی خوای پەروەردگارو، فێربوون دەرس وعیبرەت لەو قورئانەو، ونۆشینی ئاوی زوڵاڵی ئەو کتێبەو وەستان لەسەر دەریای بەرینی، بەوەی مرۆڤ دید وتێڕوانین وخاڵەکانی دەستپێکی خۆی لەو قورئانەوە وەرگرێت، دیارە کە هۆکاری ڕێنموونی وتەوفیقی خوای پەروەردگار وڕێز ومەکانەتی ئەو بەندەیەیە لە لای خوای گەورەدا، چۆن وا نەبێ کە قورئان ئەو کتێبەیە کە تەواوی خێر وچاکەی لە نێو خۆدا کۆکردۆتەوە {كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ ..} — ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە دامانبەزاندووە بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی ئایەتەکانی لێك بدەنەوە و بیری لێ بکەنەوە.

تێڕامانیش لە کتێبی خوای پەروەردگار - وەك عیبادەتێك - پەیوەست بە یەك لایەنی ئەو قورئانەوە نییە، بە پێچەوانەی ئەوانی حەز بە هەڵبژاردەیی وجیاکردنەوەی لایەنەکانی ئەو کتێبە دەکەن لە یەکترەوە. دیارە کە ڕێبازی پەیامبەرانیش لە بانگەوازداو، ئەولەویەت وخاڵە لە پێش وگرنگترینەکانی ئەو بانگەوازەو، شێوازی چارەسەرکردنی پەیامبەران بۆ کێشەو بەربەستەکانی بانگەواز، لەگەڵ ئەو هەڵبژاردانەی لە لایەن نەیارانی ئەو بانگەوازەوە ئەخرانە بەر دەمیان، هەموو ئەوانە جێگەی تێڕامان و لێ وردبوونەوەن وشایەنی ئەوەن مرۆڤ لەبەر دەمیاندا بوەستێ.

زۆرێك لە بارەی پەیڕەو وشێوازی پەیامبەران لە بانگەوازدا نووسراوە، بەڵام تەنها کەمێك لەوانە ئاماژە بەو هەڵبژاردانە دەکەن کە نەیارانیان ئەیانخستنە بەر دەمیانەوە، من بە پێی دیدی کورتی خۆمەوە پێم وایە کە هۆکاری بایەخ نەدان بەو لایەنە دەگەڕێتەوە سەر وردی پێوەرەکان وتیژی وڕاستی ئەو پێوەرانە، کە وا لە هۆشی مرۆڤ دەکەن بە پرۆسەیەکی زۆر خێراوە ئەو پێوەرانە لەسەر خۆیدا جێبەجێکا .. بۆیە خۆ گێل کردن لەو پێوەرانە هۆکار ودەروازەیە بۆ هێلانەوەو پاراستنی بریقەی ئەو بانگخوازە ساختەیەی، کە لافی ئەوە لێ ئەدا پەیڕەوی ئەو وپەیڕەوی پەیامبەران لەسەر یەك ڕێبازن، بێ ئەوەی کەس شك وگومانێکی لێ بکات وترسێکی لێوە دروست بێ.

بۆیە با بێین کەمێك لەو هەڵبژاردانەی باسمان کردن بڕوانین وهەست بە کاریگەرییان لەسەر ناخ و ویژدانی ئەو پەیامبەرانە بکەین، جگە لە کاریگەری وەحشەتناکیان لە واقیعی پەیامبەراندا .. لەگەڵ ئەوەی دڵنیام کە هەست کردن بە ئازاری ئەو هەڵبژاردانەی خوای پەروەردگار لە کتێبەکەی خۆیدا تا هەتا هەتایی تۆماری کردوون، پێویستی بە مێژوویەکی هاوشێوەی ئەو ئێش وئازارانە لە لای خوێنەردا هەیەو، بە پێی ئەو ئەندازەیەوە ئاستی هەست کردن بەو ڕاستیانە بەرز ونزم دەبێتەوە.

{وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ} – بێ باوەڕ وکافران بە پەیامبەرەکانی خۆیان گوت؛ یا دەربەدەرتان دەکەین ولە خاکی خۆماندا وەدەرتان دەنێین،و، یا ئەوەتا دێنەوە نێو میلەت وپەیڕەو وڕێبازمانەوە، ئەو کات خوای پەروەردگار وەحی بۆ ئەو پەیامبەرانە کرد وپێی ڕاگەیاندن کە؛ دڵنیا بن ستەمکاران لە نێو دەبەین.

لە پەیڕەوی پەیامبەراندا هیچ خاڵی بە یەك گەیشتن لەگەڵ گومڕایی ونیمچە چارەسەر بوونی نییە، ناکرێ بە هیچ جۆرێکیش بە چارەسەرێکی ئاواوە ڕازی بن، چونکە پەیڕەوی ڕاست ودروست ناکرێ لە هیچ شتێکدا بە نەیاران وناحەزانی بگاتەوە .. هەڵبژاردەکانی سەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەران دا یا وەدوورخستنەوەیە - بە ئاستە جیا جیاکانی ئەو دوورخستنەوەیەو - یا شوێنکەوتن وتەبەعیەتی گومڕاییە - بە ئاست وئەندازە

جیاوازەکانییەوە - .. بەڵکو جاری وا هەیە پەیامبەری بەڕێز ئەخرێتە بەردەم یەك تاکە هەڵبژاردەیەك وهیچ دەروازەیەکی تری بۆ ناهێڵرێتەوە، کاتێك کە بەرامبەرەکانی توندییەکی ئەفسانەیی لەو پەیامبەرەوە بەدی دەکەن وەك خوای پەروەردگار بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: {قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ .. قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ} – وتیان؛ ئەگەر ئێوە لە شوێنکەوتنی ئەو خواوەندانەتان ڕاست دەکەن، بیسوتێنن وخواوەندەکانتان سەرخەن .. ئێمەش [لە لای خۆمانەوە] گوتمان؛ ئەی ئاگر، تۆ بۆ ئیبراهیم سارد وسەلامەتی بە.

ئا لێرەدا پرسیارێکم لە خەیاڵدا بۆ دەمێنێتەوەو لە ئاسۆی ویژدانمادا هەڵدەفڕێت ومەغزم ئەکوتیێ؛ کە هۆکاری فڕێدانی ئیبراهیم علیه السلام بۆ نێو ئاگر چی بوو ؟

باشە ئیبراهیم علیه السلام نەیدەتوانی هۆکاری ڕق هەڵسانی نەیارانی بڕێك دواخات یا هەر لایدا – کە بریتی بوو لە تەبەرا کردن لەو موشریکانەو بێ ئەرزش کردنی بت وپەیکەرەکانیان وتێکشکاندنی ئەو بت وپەیکەرانە - .. خۆ ئەیتوانی دڵی خۆی بە هەندێك دەستکەوتی بانگەواز دڵخۆشکا لە بەرامبەر ئەو دواخستن ولادانەدا ..

مەگەر نەیئەتوانی فیقهی مەسڵەحەت (بەرژەوەندی) ومەفسەدەت (کە واتای دەرەنجام وشتی خراپ ئەدات) بخاتە کار [واتا لێك جیا کردنەوەی مەسڵەحەت ومەفسەدەت وناسینەوەیان]، بۆ ئەوەی لە بڵێسەی ئاگر وئێش وئازاری ئەو ئاگرە ڕزگاری بێ ...

ئا ئەمەن براکەم هەڵبژاردەکانی بەردەم پەیامبەران، ئەمەش میلەتی ئیبراهیمە ..

هەوڵ دە جارێکی تر بڕوانیتە ئەو هەڵبژاردانە، چەندە بە ئێش وئازار وبێ ڕەحمانەن، پاشان سەیرێکی واقیع وژیانی خۆت بکەو ئاوڕێکی ڕاست وچەپی خۆت بدەوە، یا گەر ئەتەوێ بە چاوی "زرقاء اليمامة"ـەوە بڕوانە .. [1]

---

(1)ئافرەتێك بووە لە عەرەبستان بەو نێوە بەناوبانگ بووە، دەگێڕنەوە دەڵێن کە ئافرەتێکی زۆر ورد بین بووە ودیدێکی تیژی هەبووە، کە ڕێبواری لە دووری سێ ڕۆژە ڕێوە بینیوەو مووی سپی لە نێو ماستدا بینیوە، تا دوایی.

دەی با سەیری هەڵبژاردەکانی بەردەم بانگخوازانی سەردەم بکەین، کە لافی هەڵگرتنی پەیڕەوی پەیامبەران لێئەدەن لە بانگەوازدا، هەر ئەو هەڵبژاردە کۆنانەن یا هەڵبژاردەی گوڵاوی ورەنگاو ڕەنگ وبۆنخۆشن ؟

ئایە بانگخوازانی سەردەم کە لافی هەڵگرتنی پەیڕەوی پەیامبەران لێ ئەدەن لە بانگەوازیاندا، هیچ بێزارکاری وئازاردانێکیان دێتە رێ، یاخود خودی نەیارانیان ڕێگەیان بۆ خۆش دەکەن ؟

ئایە هیچ کەسێکیان دەستی بە ئاگری تەنگ پێهەڵچنین وناو زڕاندن ودوورخستنەوە لە مەیدانی کاریگەر بووندا سوتاوە، باسی دوورخستنەوەی لە شتی ترەوە ناکەین، یا ئاوەتا ئەیانبینی لە نیعمەت وخۆشی بەدەرخستن دان وسەکۆی قسەکردنیان لەگەڵ جەماوەردا پێ ئەدرێت ولە هەموو لایەکەوە پیرۆزبایی ودەستخۆشییان بەسەردا دەڕژێ ..

هەر کەسێك لە دیمەنە بانگخوازییەکانی کتێبی خوای پەروەردگار بڕوانێت وبە عەدەسەی تێڕامانییەوە لێی ورد بێتەوەو، بە دوای خاڵە سەرەتاییەکان ودەستپێکی جموجوڵی بانگخوازی پەیامبەرانەدا بگەڕێت، بە یەك ڕاستیی نەگۆڕەوە دەگات ئەویش ئەوەیە کە ..

لێکچوونی تەواو لە پەیڕەوی بانگخوازی بۆ خوا سوڵحاو وپەیڕەوی پەیامبەران دا؛ بێ گومان لێکچوونی هەڵبژاردەی نەیارانیشی لەگەڵدایە لە سەردەمی ژیانی ئەو بانگخوازەدا، کاتێك کە ئەو دووەش لێك جیا دەبنەوە – واتا پەیڕەو وسەرەنجامی هەڵبژاردەکان – دیارە کە بانگەوازەکە تەم ومژی وساختەیی تێکەوتووەو نوورەکەی تەنها بریقەیەکی درۆیین فریوبەرە ..

ئەگینا چۆن تۆ خۆت بە شوێنکەوتەی ڕێبازی ئەو پەیامبەرانە ئەزانیت ورێگەی تۆ بە دوڕ ومروارییەوە پۆشراوە ؟

بێ گومان شتی وا لە ڕاستییەوە زۆر دوورە ..

{الم .. أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ.. وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ} – الـم .. ئایا خەڵکی وایانزانیوە، وازیان لێدەهێنرێت و

پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی سزا و ئازار نەکرێن؟ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٦